محمد ﷺ هەر چۆن خضر دەرچوو لە شەریعەتی موسی عليه السلام؛ ئەوە کافرە.

دەیەم: پشت کردن لە ئاینی الله تعالى فێری نەبێت و کاری پێنەکات، بەڵگەش الله تعالى دەفەرموێت: {وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ}. واتا: (کێ لەمە ستەمکارترە کە باسی ئایەتەکانی پەروەردگاری بۆ دەکرێت پاشان پشتی لێدەکات بە ڕاستی ئێمە بۆ ستەمکاران تۆڵە سێنین).

* جیاوازی نیە لەهەموو هەڵوەشێنەرەوەکان چ بەگاڵتە بێت یان بە ڕاستی بێت یان لەترسا بێت جگە لە زۆر لێکراو، وە هەموویان هە ڕەشەکانیان گەورەن، خەڵکی زۆر دەکەونە ناوی، پێویستە لەسەر موسڵمان کە ئاگاداری بێت و بترسێت لەوەی بکەوێتە ناوی.

پەنا دەگرین بە الله لەو شتانەی کە سزای الله واجب دەکات، وە پەنا دەگرین لەسزای بەئێش.

وَصَلَّى اللهُ عَلَى خَيْرِ خَلْقِهِ مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ

وتەی کۆتای هات رحمه الله



مكتبة الهمّة
دەوڵەتی ئیسلامی

# هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام

شێخ موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب رحمه الله

ڕەجەب
١٣٤٨
کۆچی

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بزانە کە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام دە هەڵوەشێنەرەوەن:

یەکەم: شەریك دانان لە عیبادەتی اللە، اللە تعالی دەفەرموێت: {إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِـمَن يَشَاء}، واتا: (بە دڵنیاییەوە اللە خۆش نابێت ئەگەر شیرك وهاوبەشی بۆ بڕیار بدرێ، خۆش دەبێت لە جگە لە شیرك بۆ کەسێك کە بیەوێت) وە دەفەرموێت: {إِنَّـهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَـرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَـأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ}، واتا: (چاك بزانن کەسێك شەریك و هاوبەش بۆ اللە دابنێ بێگومان اللە بەهەشتی لەسەر حەرام کردوە، جێگە و شوێنی ئاگرە، ستەمکارانیش هیچ جۆرە یارمەتی دەرێکیان بۆ نیە ورزگار نابن).

لەجۆرەکانی شیرك: قوربانی کردن بۆ جگە لە اللە وەك ئەو کەسەی کە قوربانی بۆ جنۆکەکان یان گۆڕ ومەرقەدێك ئەنجام دەدات.

دووەم: هەرکەسێك لە نێوان خۆی و اللە واسیتە وناوەند دابنێت ولێیان بپاڕێتەوە وداوای شەفاعەتیان لێبکا، وە پشتیان پێ ببەستێت بە کۆدەنگ (اجماع) ئەو کەسە کافر دەبێت.

سێیەم: هەر کەسێك هاوبەشدانەران (موشریکەکان) کافر نەکات یان گومانی هەبێت لە کافربوونیان یان ڕێباز و بەرنامەکەیان بە ڕاست دابنێ کافر دەبێت.

چوارەم: هەر کەسێك پێی وابێت کە ڕێبازێکی تر جگە لە ڕێبازی محمد ﷺ تەواوترە، یان حوکمێکی دیکە باشترە لە حوکمی ئەو، وەك ئەو کەسەی حوکم



وفەرمانی تاغوتەکان بە چاکتر دادەنێت لەسەر حوکمی اللە ئەوە کافرە.

پێنجەم: هەر کەسێك ڕقی لە شتێك بێتەوە لەو پەیامەی محمد ﷺ هێناویەتی هەرچەندە کاریشی پێبکات کافر دەبێت.

شەشەم: هەرکە سێك گاڵتە بە شتێك لە ئاینی محمد ﷺ یان گاڵتە بە پاداشت یان سزایەکی اللە بکات کافر دەبێت بەڵگەش اللە دەفەرموێت: {وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ * لاَ تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ}، واتا: (ئەگەر پرسیاریان لێبکەی (خەریکی چین)؟؟ ئەوە بێگومان دەڵێن: بە ڕاستی ئێمە تەنها گەمە و گاڵتەمان دەکرد پێیان بڵێ ئایا ئێوە بە اللە و ئایەتەکانی و ڕەسولەکەی گاڵتەتان کرد؟! عوزرتان نیە کافر بوون دوادئەوەی ئیماندار بوون).

حەوتەم: جادوو -وەلەوانە: لێك دابڕان وبەیەکگەیاندن-، ئەوەی کردی یان پێی ڕازی بوو؛ ئەوە کافرە بەڵگەش اللە تعالی دەفەرموێت: {وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ}، واتا: (ئەوانیش کەسیان فێری هیچ شتێك نەدەکرد تا پێیان نەوتایە: ئەم کارەی ئێمە بۆ تاقی کردنەوەیەو خۆت کافر مەکە).

هەشتەم: سەرخستنی هاوەڵگەران و یارمەتیدانیان لەسەر موسڵمانان، وە بەڵگەش: {وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ}. واتا: (ئەوەی لەئێوە دۆستایەتی ئەوانی کرد ئەوە لەوانە بە ڕاستی اللە ڕێنمونی گەلی ستەمکار ناکات).

نۆیەم: ئەوەی پێی وابێت هەندێك لەخەڵکی دەتوانن دەرچن لە شەریعەتی